


# وانە گرینگەکان
## بۆ تێکڕای موسڵمانان

نووسینی:
عبدالعزیز بن باز

وەرگێڕانی : باوکی عبدالرحمن

# وانه گرینگەکان
## بۆ تێکڕای موسڵمانان


نووسینی
زانای ئیسلامی
عبدالعزیز بن عبد الله بن باز



وەرگێڕانی
باوکی عبدالرحمن

لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی ڕەوشەن
زنجیرە -٤-



## ناوی کتێب بەعەرەبی : الدروس المهمة لعامة الأمة

## ناوی کتێب بە کوردی : وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

نووسینی : عبدالعزیز بن باز
وەرگێڕانی : باوکی عبدالرحمن
پێداچوونەوەو هەڵەچن : بارزان رمضان
چاپ : هەولێر / ٢٠١٣
تیراژ : ٢٠٠٠
دیزاین : جمعە صدیق کاکە

بۆ پەیوەندی کردن :
مۆبایل: 07807136000
ئیمێڵ : rawshan.project@gmail.com
فەیسبوک: www.facebook.com/Rawshan.kteb

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان
وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

## ووتەی وەرگێڕ:

بسم الله الرحمن الرحیم

سوپاس و ستاییش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، ڕاگری ئەرزو ئاسمان، بە بەزەیی و دلۆڤان، لێبوردەی میهرەبان، جێی ئومێدی هەمووان، خالقی ئینس و جان. وە دروودو سەلام لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەر، پێشەواو سەروەر، وە سەلامی خوا لەسەر خانەوادە و هاوەڵە بەڕێزەکانی تا ڕۆژی دوایی.

خوێنەرانی بەڕێز... بە هاوکاری ستافی (پێگەی سێبەر) هەستاین بە وەرگێڕانی نامیلکەی (الدروس المهمة لعامة الأمة) کە تا ئێستا وەرگێڕدراوە بۆ زیاتر لە ١٧ زمانی جیهانی ، لەبەر پڕسوودی و گرنگی ئەم بابەتە.

ئێمەش بە پێویستمان زانی کە کتێبخانەی کوردەواری لێـی بـێ بەش نەبێـت. چـونکە ئەوەی لەم نـامیلکەیەدا هـاتووە پێویستی هەمـوو تـاکێکی موسـوڵمانە. وە ئـێمەش وەکـو ئەرکێکـی ئـاینی بە پێویسـتمان زانـی کە تـاکی کوردی موسوڵمانی پێ ئاشنا بکەین. وە هەستاوین وەکـو خـۆی وەرمـان گێـڕاوە لەگەڵ زیـاد کردنـی چەنـد پەراوێزێـک دا. وە ڕاڤەی ئایەتەکانمـان لە (تەفسـیری ئاسان) وەرگرتووە.

باوکی عبدالرحمن

وانه گرینگه‌کان بۆ تێکڕای موسلمانان

**پێشه‌کی :-**

## بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆ په‌روه‌ردگاری جیهانیان، وه سه‌رئه‌نجام بۆپارێزکارانه. وه صه‌لات و سه‌لام له‌سه‌ر به‌نده‌و ڕه‌سولی خودا موحه‌مه‌د ﷺ وه له‌سه‌ر خانه‌واده‌و یارو یاوه‌رانی به تێکڕا.

پاشان...

ئه‌م بابه‌ته کورته‌یه‌که بۆ ڕۆشن کردنه‌وه‌ی هه‌ندێک له‌و واجیباتانه‌ی که پێویسته تێکڕای خه‌ڵکی بیزانن ده‌رباره‌ی دینی ئیسلام، وه ناوم لێنا به (وانه گرینگه‌کان بۆ تێکڕای موسلمانان).

وه داواکارم له په‌روه‌ردگار که بیکاته مایه‌ی سوودو که‌ڵک بۆ موسوڵمانان و له منیشی قه‌بوڵ بکات، وه هه‌ر خۆشی به‌خشنده‌یه.

عبدالعزيز بن عبد الله بن باز

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

# وانە گرینگەکان
# بۆ تێکڕای موسڵمانان

## وانەی یەکەم: سورەتی فاتیحەو سورەتە کورتەکان

دەبێ هەموو موسوڵمانێک سورەتی فاتیحە و ئەوەی دەتوانێت لە سورەتە کورتەکان، لە سورەتی {الزلزلة} هەتا سورەتی {الناس}ی لەبەر بێت، بەخوێندنەوەیەکی ڕاست و دروست، وەهەروەها تێگەیشتن لە ماناکانی.

## وانەی دووەم: پایەکانی ئیسلام

ڕوونکردنەوەی پێنج پایەکانی ئیسلام.

یەکەمیان کە گەورەترینیانە: شایەتی دانە کە هیچ پەرستراوێک نییە شیاوی پەرستن بێت بە حەق جگە لە خودای پەروەردگار، وە موحەمەد ﷺ نێردراوی خودایە، لەگەڵ ڕۆشنکردنەوەی ماناکەی.

هەروەها ڕونکردنەوەی ماناو مەرجەکانی {لا الە الا اللە}. مانای {لا الە} واتا ڕەتکردنەوەی هەموو پەرستراوێک

جـگە لە خـوداى گەورە. وە {الا الـلە} واتـا چەسـپاندنى پەرستشـە بـۆ خـوداى گەورە بەتەنهـا، وە هـيچ هاوبەشـێکى نييە.

وە مەرجەکانى {لا اله الا الله} ئەمانەن:

زانيـارى کە لابەرى نەزانيـنە، وە دڵنيـايى کە لابەرى گومانە، وە دڵسۆزى (الاخلاص) کە لابەرى هاوبەشى دانانە، وە ڕاستگۆيى کە لابەرى درۆيە، وە خۆشەويستى کە لابەرى ڕق لێبـونەوەيە، شـوێن کەوتـن و پەيـڕەو کردنـى کە ڕەت کەرەوەى سـەرپێچى و وازلێهێنـانيەتى، وە قەبـوڵ کـردن کە لابەرى ڕەت کـردنەوەيە، وە بـاوەڕ نەبـوون بە هەمـوو پەرستراوێک جـگە لە خـوداى گەورە. وە هەر وەک لەم دوو دێڕە شيعرەدا کۆکراوەتەوە:

علـم يقـين وإخـلاص وصـدقك مـع
محبـة وانقيـاد والقبـول لهـا
وزيـد ثامنهـا الکفـران منـك بمـا
سـوى الإلـه مـن الأشـياء قـد ألهـا

لەگەڵ ڕوونکـردنەوەى شـايەتى دان کە مـوحەمەد ﷺ نێـردراوى خـودايە، کە ئەم شـتانە لەخـۆ دەگرێت: بەڕاسـت

دانـانی ئەو هەواڵانەی کە پێـی گەیانـدووین، وە گـوێڕایەڵی فەرمانەکـانی، وە دوورکەوتــنەوە لەوەی کە ڕێگــری لــێ دەکات. وەخودای گەورە نەپەرسترێت تەنها بەو شێوەیە نەبێت کە خودا یان پێغەمبەر ﷺ باسیان کردووە.

ئینجا بـۆ قوتابیـان پێـنج پایەکـانی تـری ئیسـلام ڕوون بکــرێتەوە کە ئەمــانەن: نــوێژ، زەکــات، ڕۆژوی مــانگی ڕەمەزان، وە حەج کردنـی مـاڵی خـودا، بـۆ ئەو کەسـەی کە بتوانێت.

## وانەی سێهەم: پایەکانی باوەڕ

کە شەشـــن: بـــاوەڕ بـــوون بە خـــودای گەورە، وە بە فریشتەکانی وە بەکتێبە ئاسمانیەکان، وە بە نێردراوەکانی، وە بە ڕۆژی دوایـی، وە بـاوەڕت هەبێـت بە قەزاو قەدەر لە خێـرو شەڕی کە هەمووی لە لایەن خوداوەیە.

## وانەی چوارەم: بەشەکانی یەکتاپەرستی (التوحد) و بەشەکانی هاوبەشی دانان(الشرک)

ڕوونکردنەوەی بەشەکانی یەکتاپەرستی، کە سێ بەشن: یەکتاپەرسـتی پەروەردگـارێتی (الربوبیـة)، یەکتاپەرسـتی

پەرستش (الألوهية)، وە یەکتاپەرستی ناوو سیفاتە جوانەکانی خودای گەورە.

**یەکتاپەرستی پەروەردگاریتی:**

ئەوەیە کە باوەڕت هەبێت کە خودای گەورە بەدیهێنەر و هەڵسوڕێنەری هەموو شتێکە، کەس شەریکی نییە لەمەدا.

**یەکتاپەرستی پەرستش:**

ئەوەیە کە باوەڕت وابێت کە خودای پاک و بێگەرد تاکە پەرستراوێکە بە حەق و هیچ هاوبەشی نییە. وە ئەمەش مانای {لا الـه الا الـله} یە. لەبەر ئەوەی واتاکەی ئەوە دەگەیەنێ کە هیچ پەرستراوێک نییە بە حەق کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خودای گەورە. وە کۆی پەرستشەکان لە نوێژو ڕۆژوو وە ئەوانی تریش پێویستە دڵسۆزانە تەنها بۆ خودای گەورە ئەنجام بدرێت. وە نابێت هیچ شتێك لەوانە بۆ کەسێکی تر بکرێت.

**یەکتاپەرستی ناوو سیفاتە جوانەکانی خودای گەورە:**

ئەوەیە کە باوەڕت هەبێت بە هەموو ئەو ناو و سیفاتانەی کە لە قورئان و فەرموودەی درووستدا هاتووە، وەچەسپاندنیان تەنها بۆ خودای گەورە بێت بە شێوەیەک کە شیاو خۆی بێت، بە بێ گۆڕین (تحريف) و لەکار خستن (تعطيل) و

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان
وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

چۆنیەتی (تکییف) و بە بێ لێک چواندن (تمثیل). ئەویش بە بەڵگەی فەرمودەی خودای گەورە:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ۝٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ۝٤ ﴾

واتا:

١.(ئەی محمد ﷺ ئەی ئیماندار) بڵێ: ئەو خوای کە ناوی -الله-یە خوایەکی تاک و تەنهایە (بێ هاوەڵ و هاوتایە).

٢.خوا زاتێکی پایەدار و دەسەڵاتدارە، نیازی بە کەس نییەو هەموویان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێ بەڵاو و ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێ بە جێ بکات.

٣.هیچ کەسی لێ نەبووە و خۆشی لە کەس نەبووە.

٤.هەرگیز هاوتاو هاوشێوە و دەسەڵاتدارێکی تر نییە کە لەبەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت.

وە فەرموودەی خودای گەورە:

﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ۝١١ ﴾ [الشورى : ١١]



وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان
وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

واتا: هیچ شتێك نیه لـه وێنـەی ئەوزاتـە، هـیچ شـتێك لـەو ناچێت (چونكه خوایه و بەدیهێنەره، چۆن له بـەدیهێنراوەكانی دەچێت) هەر ئەویش بیسەرو بینایه .

وه هەندێک له زانایان یەک تا پەرستیان کردوه به دوو بەشـەوە. یەكتاپەرستی نـاو و سیفاته جوانەكانیـان له ڕیـزی یەكتاپەرسـتی پەروەردگارێتیـدا دانـاوە. وه كێشـه نیـیه له بەكارهێنـــانی دەســـتەواژەی جیـــاوازدا، لەبەر ئەوەی له هەردوولادا مەبەستەكه ڕۆشنه.

**وه جۆرەكانی هاوەڵ بڕیاردان (شیرک) سیانن:**
شیركی گەوره، شیركی بچوک وه شیركی شاراوه.

**شیركی گەوره:**

كردەوەكان پووچ دەكاتەوەو ئەو كەسەی لەسەری بمرێت به نەبڕاوەیـی دەیبـاته ئـاگرەوە. هەروەكـو خـودای پەروەردگـار دەفەرموێت:

﴿ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾ [الأنعام : ٨٨]

واتا: ئەگەر شەریک و هاوبەش بڕیار بدەن، ئەوه هەرچی كارو كردەوەیان هەیه هەمووی پووچ و بێ نرخ دەبێت.

وە خودای پاک و بێ گەرد دەفەرموێت:

﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ شَـٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ۚ أُولَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَـٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ [التوبة : ١٧]

واتا: شیاو وشایستە نەبووە بۆ موشریک و هاوەڵگەران کە مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە، لەکاتێکدا خۆیان شایەتن لەسەر خۆیان کە بێ باوەڕن، ئەوانە هەموو کارو کردەوەکانیان بێ نرخە و پووچەڵ بۆتەوە، ئەوان لەناو ئاگری دۆزەخدا (لە ژیانی کولە مەرگیدا) بەردەوامن.

وە هەر کەسێک لەسەری بمرێت لێ خۆشبوونی بۆ نییە، وە بەهەشتی لێ حەرام دەبێت، هەروەکو خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ... ﴿٤٨﴾ ﴾ [النساء : ٤٨]

واتا: بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت.


وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

وه خودای گه‌وره ده‌فه‌رموێت:

﴿إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ﴿٧٢﴾﴾ [المائدة : ٧٢]

واتا: دڵنیابن ئه‌وه‌ی شه‌ریک و هاوبه‌ش بۆ خوا بڕیار بدات، ئه‌وه بێگومان خوا به‌هه‌شتی له‌سه‌ر حه‌رامكردووه و شوێن و جێگاو سه‌ره‌نجامی ئاگره، ئه‌وسا ئه‌و سته‌مكارانه هیچ جۆره پشتیوانێكیان نی یه (كه‌س ناتوانێت فریایان بكه‌وێت).

وه له جۆره‌كانی شیركی گه‌وره: نزاو پاڕانه‌وه و داوای یارمه‌تی كردن له بت و مردووه‌كان، وه نه‌زرو قوربانی كردن بۆیان وه هه‌روه‌ها هاوشێوه‌ی ئه‌مانه.

## هاوەڵ بڕیاردانی بچووك:

ئه‌وه‌یه كه له ده‌قه‌كانی قورئان و سووننتدا هاتووه و ناوبراوه به هاوه‌ڵ بڕیاردان (شیرك). به‌ڵام ئه‌مه له جۆری هاوه‌ڵ بڕیاردانی گه‌وره نییه. هه‌روه‌كو ڕیایی كردن له هه‌ندێ كرده‌وه‌دا و سوێند خواردن به غه‌یری خودای گه‌وره، وه وتنی (ما شاء الله و شاء فلان) واتا ئه‌وه‌ی خودای گه‌وره بییه‌وێت و فلان كه‌سیش بییه‌وێت، وه هاوشێوه‌ی ئه‌مانه. له‌به‌ر





وانه گرینگه‌كان بۆ تێكڕای موسڵمانان

فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ : **(أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر)**[1] ئەوەی که من زۆرترین ترسم هەیه لێی لەسەر ئێوه هاوەڵ بڕیاردانی بچوکه. وه دەربارەی ئەم فەرمووده‌یه پرسیار کرا له پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الرياء) رووپامایيه، ئەم فەرمووده‌یه ئیمامی ئەحمەدو طەبەرانی و بەیهەقی له محمود بن لبيد الانصاريەوه گێڕاویانەتەوه به سەنەدێکی باش(جید)، وه هەروەها طەبەرانی به چەند سەنەدێکی باش(جید) له (محمود بن لبيد)ەوه، له (رافع بن خديج)ەوه له پێغەمبەرەوه ﷺ گێڕاویانەتەوه.

وه فەرمووده‌ی پێغەمبەر ﷺ : **من حلف بشيء دون الله فقد أشرك**[2]. واتا هەرکەسێک سوێند به شتێک بخوات جگه له خودای گەوره ئەوا هاوەڵی بۆ بڕیار داوه. ئەم فەرمووده‌یه ئیمامی ئەحمەد به سەنەدێکی درووست له عومەری کوڕی خەطابەوه (ڕەزای خوای لەسەر بێت) گێڕاویەتیەوه، وه ئەبو داودو ترمذی به ئیسنادێکی درووست

---

١ أحمد ٥/٤٢٨

٢ البخاري الايمان والنذور ٦٢٧١، مسلم الأيمان ١٦٤٦، الترمذي النذور والأيمان ١٥٣٣، النسائي الأيمان والنذور ٣٧٦٤، أبو داود الأيمان والنذور ٣٢٤٩، ابن ماجه الكفارات ٢٠٩٤، أحمد ٤٧/١، مالك النذور والأيمان ١٠٣٧، الدارمي النذور والأيمان ٢٣٤١.

گێڕاویانەتەوە لە ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لەسەر بێت) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك)**[1].

واتا هەرکەسێک سوێند بەغەیری خودا بخوات ئەوا بێ باوەڕ یان موشریک دەبێت. وە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ : **(لا تقولوا: ما شاء الله وشاء فلان ولكن قولوا: ماشاء الله ثم شاء فلان)**[2]. واتا مەڵێن خوداو فڵان کەس ویستیان وابوو، بەڵکو بڵێن خودا ویستی هەبوو پاشان فڵان کەس ویستی لێبوو. ئیمامی ئەبو داود بە سەنەدێکی درووست هێناویەتی لە حوذەیفەی کوڕی یەمانەوە.

وە ئەم جۆرە خاوەنەکەی لە دین دەرناکات وە بە نەبڕاوەییش لەئاگردا نامێنێتەوە (بەڵام تەواوێتی یەکتاپەرستی پێویست لادەبات) واتە: ئەو کەسە تەواو یەکتار پەرست نیە.

---

١ البخاري الأدب ٥٧٥٧، مسلم الأيمان ١٦٤٦، الترمذي النذور والأيمان ١٥٣٥، النسائي الأيمان والنذور ٣٧٦٦، أبو داود الأيمان والنذور ٣٢٥١، ابن ماجه الكفارات ٢٠٩٤، أحمد ٦٩/٢، مالك النذور والأيمان ١٠٣٧، الدارمي النذور والأيمان ٢٣٤١.

٢ أبو داود الأدب ٤٩٨٠، أحمد ٣٩٩/٥




وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

**جۆری سێیەم: هاوەڵ بڕیاردانی شاراوە و پەنهان:**

وە بەڵگەش فەرموودەی پێغەمبەری خودایە ﷺ: **الا اخبركم بما هو اخوف عليكم عندي من المسيح الدجال؟ قالوا: بلى يا رسول الله قال: الشرک الخفي، يقوم الرجل فيصلي فيزين صلاته لما يرى من نظر الرجل اليه[1].**

واتا ئایا هەواڵتان پێ بدەم بەوەی کە لە مەسیحی دەجال ترسناکترە لەسەر ئێوە؟ ووتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ، فەرمووی: هاوەڵ بڕیاردانی شاراوەیە، کاتێک کەسێک هەڵدەستێت نوێژ دەکات و نوێژەکەی دەڕازێنێتەوە کە دەزانێت کەسێک سەیری دەکات.

ئەم فەرموودەیە ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا لە ئەبی سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لەسەر بێت) گێڕاویەتیەوە.

**وە دەکرێت هاوەڵ بڕیاردان بکەینە دوو بەشەوە:**

گەورەو بچوک، بەڵام هاوەڵ بڕیاردانی شاراوە (شرک الخفي) گشتگیرترەو لە هەردوو(شیرکی گەورە و بچوک)دا هەیە. هاوەڵ بڕیاردانی شاراوە لەناوهاوەڵ بڕیاردانی گەورەدا وەک هاوەڵ بڕیاردانی دووڕووەکان، چونکە باوەڕە

---

[1] ابن ماجه الزهد ٤٢٠٤، أحمد ٣/٣٠

پووچەکانیان دەشارنەوە و ئیسلامەتییەکی ڕووپامایانە پیشان دەدەن تا خۆیانی پێ بپارێزن. وە هاوەڵ بڕیاردانی شاراوە لەناوهاوەڵ بڕیاردانی بچوکیشدا هەیە، وەک ڕوپامایی، کە لە فەرموودەکەی محمود بن لبید الانصاریدا هاتووە و پێشتر باسمان کرد، وە فەرموودەی ئەبی سەعید کە باس کرا. وە خودای گەورە سەرکەوتوومان بکات.

## وانەی پێنجەم: چاکە (الاحسان)

پایەی چاکە ئەوەیە کە خودا بپەرستیت هەر وەک بیبینیت، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینیت ئەوا خودای گەورە تۆ دەبینێت.

## وانەی شەشەم: مەرجەکانی نوێژ[1]

کە نۆ دانەن: ئیسلام، ژیری، جیاکردنەوە[2]، دەستنوێژ، لابردنی پیسی[3]، داپۆشینی عەورەت، ضوونة کاتی نوێژ، ڕووکردنە قیبلە، نییەت.

---

١ بە بێ ئەم مەرجانە نوێژ دانامەزرێت
٢ کاتێک مندال دە بێتە ٧ ساڵ ڕاست و چەپی خۆی جیادەکاتەوە
٣ لابردنی پیسی لەسەر جەستە ،جلوبەرگ، شوێن

## وانەی حەوتەم: پایەکانی نوێژ[1]

که چواردەن : وەستان بەپێوه ئەگەر توانیت، وتنی (الله اكبر) بۆ دابەستنی نوێژ، خوێندنەوەی سورەتی فاتیحه، ركوع بردن، ڕێکبوونەوە لەدوای ڕكوع، سوجدەبردن لەسەر حەوت ئەندامەکە[2]، هەستانەوە له سوجده، دانیشتن له بەینی دوو سوجدەکەدا، دڵنیایی له هەموو کارەکاندا، ریزبەندی پایەکان[3]، تەحییاتی ئەخیر، دانیشتن بۆ تەحییات، صەلاوات دان لەسەر پێغەمبەرﷺ، سەلام دانەوە.

## وانەی هەشتەم: واجباتەکانی نوێژ

که هەشتن: وتنی هەمو (الله اكبر)ێك بێجگه له تەكبيرەی دابەستنی نوێژ، ووتنی (سمع الله لمن حمده) بۆ ئیمام و ئەوەی بەتەنیا نوێژ بکات، وتنی (ربنا ولك الحمد)

---

١ ئەگەر یەكێك لەم پایانه له نوێژەكەدا نەبێت ئەوا ئەو نوێژە دانامەزرێت و بەتاڵە. وە ئەگەر پایەیەكت لەبیرچوو ئەوا ئەبێ بگەڕێیتەوە بۆ سەر پایەكەو لەوێوە بەردەوامبیت. وەپێویستە دوو سوجدەی سەهو بەریت.

٢ ناوچەوان و لووت، هەردوو دەست، هەردوو ئەژنۆ، پەنجەی هەردوو پێ یەكان.

٣ پایەكانی نوێژ پێشو پاش ناخرێن و لەسەرەوەبۆ خوارەوە ئەنجام دەدرێن.

بـۆ هەمـووان، وتنـی یەک جـار (**سـبحان ربـي العظـيم**) لە رکوعدا، وتنی یەک جار (**سبحان ربي الاعلى**) لە سەجدەدا، وتنـی (**رب اغفـر لـي**) لە بەینـی دوو سـوجدەکاندا، وە تەحییاتی یەکەم.

## وانەی نۆهەم: باس کردنی تەحیات

ئەویش ئەوەیە کە بڵێیت:

**(التحيات لله والصلوات والطيبات، السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله).**

مـانەوەو گەورەی ومولـک هەر بۆتـۆیە خوایەگیـان، وەهەمـوو پەرستشـەکان هەر بۆتـۆیە، هەمـوو وتەیەکی بـاش وکـاری چـاکە هەر بـۆ تـۆیە، سـەلام ورەحـمەت و بەرەکەتـی خـوای گەورەت لێبێـت ئەی پێغەمـبەری خـوا ﷺ ، وە سەلامیش لە سەر ئێمەو بەندە چاکەکانی خوای گەورە بێت، وە شایەتی دەدەم کەهیچ پەرستراوێک نیە بەحەق جگە لە **اللـه**، وە شـایەتی دەدەم کە مـوحەمەد ﷺ بەنـدەو نێـرراوی خوایە.



وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان
وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

پاشان صەلاوات بدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ ، بڵێت:

**(اللهم صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد، وبارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد).**

خوایەگیان دروودو رەحمەتی خۆت ببارێنە بە سەر موحەممەد ﷺ وخانەوادەو کەسو کاریدا، هەروەک درودت باراند بەسەر ئیبراهیم و کەسو کاری ئیبراهیم دا، بەراستی تۆسوپاس کراوو خاوەن شکۆو بەخشندەیت، وەخوایە گیان فەڕو بەرەکەت ببارینە بەسەر موحەممەد ﷺ و خانەوادەو کەسو کاریدا، هەروەک فەڕو بەرەکەتت باراند بەسەر ئیبراهیم و کەسو کارەکەیدا، بەراستی تۆسوپاس کراوو خاوەن شکۆو بەخشندەیت.

پاشان لە دوای تەحییاتی ئەخیر پەنا بگرێت بە خودای گەورە لە سزای دۆزەخ وە لە سزای گۆڕ، وە لە فیتنەی ژیان و مردن، وە لە فیتنەی مەسیحی دەجال.

پاشان چی پێباشە لە نزاو پاڕانەوە دەتوانێت بیکات بۆخۆی، بە تایبەت ئەوانەی کە سونەتن، لەوانە: **(اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك ،اللهم إني ظلمت**



وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان
وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

**نفسي ظلما كثيرا، ولا يغفر الذنوب إلا أنت فاغفر لي مغفرة مـن عنـدك، وارحمنـي إنـك أنـت الغفـور الـرحيم).** واتـا: پەروەردگـارا كـۆمەكم بـكە لەسـەر يـادو سـوپاس و جـوان پەرسـتنت، وە پەروەردگـارا مـن سـتەمێكی زۆرم لە خـۆم كردووە، وە هيچ كەس لە گوناهەكان خۆش نابێت جگە لە تۆ، وە رەحمم پێ بكە چونكە بەڕاستی هەر تۆ لێ بوردەو ميهرەبانيت.

بەڵام لە تەحيـاتی يەكەمـدا لەدوای ووتنـی شـايەتمان هەڵدەسێتەوە بۆ ڕكاتی سێهەم لە نوێژی نيوەڕۆ و عەسرو مەغريب و عيشادا، وە ئەگەر صەلاوات بدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئەوا باشترە، لەبەرگشتگيری ئەو فەرمـوودانەی كە لەم بارەوە هاتون، پاشان هەڵدەستێتەوە بۆ ڕكاتی سێهەم.

## وانەی دەهەم: سونەتەكانی نوێژ

١. دوعای دەست پێكردنی نوێژ
٢. دانـانی لەپـی دەسـتی ڕاست لە سـەر دەسـتی چەپ و لەسـەر سنگ لە كـاتی وەسـتاندا، پێش ركـوع وە دوای ركوع.

٣. بەرز کردنەوەی دەستەکان هەتا ئاستی شانەکان یاخود نەرمایی گوێیەکان بە شێوەیەک کە پەنجەکان بەیەکەوە نوسابن وە لەپی دەستت کراوەبێت. ئەمە بۆ تەکبیرەی یەکەم دەکرێت وە لە کاتی رکوع بردندا، وە هەستانەوە لە رکوع، وە لە کاتی هەستانەوە لە تەحیاتی یەکەمەوە بۆ ڕکاتی سێهەم.

٤. زیاتر لە یەك جار گوتنی (**سبحان ربي العظيم**) لە رکوعدا، وە (**سبحان ربي الأعلى**) لە سجودا.

٥. ئەو زیادانەی دەگوترێت لە دوای (ربنا و لك الحمد) لە دوای هەستانەوە لە رکوع، وە زیاتر لە یەك جار داوا کردنی لێ خۆشبوون لە نێوان دوو سوجدەکەدا.

٦. سەرت لە ئاستی پشتت دا بێت لە کاتی ڕکوعدا.

٧. لەیەك دوورخستنەوەی هەریەکە لە ئەنیشکەکان لە تەنیشتەکان (ئەملاولای سک)، وە جیاکردنەوەی سك لە ڕانەکان، وە ڕانەکان لە قاچەکان لە سوجدەدا.

٨. بەرزکردنەوەی هەردوو باسك لە سەر ئەرز لە کاتی سوجدە بردندا.

٩. نوێژ خوێن قاچی چەپی ڕادەخات و لەسەری دادەنیشێت، وە قاچی ڕاستیشی دادەکوتێت. بەم شێوەیە

لە تەحیـــاتی یەکەم و لە نێـــوان دوو ســـوجدەکەدا دادەنیشێت.

١٠. (التـورك) كـردن لە تەحیـاتی كۆتاییـدا لە نـوێژە چـوار ڕكاتیەكـان و نـوێژە سێ ڕكاتیەكـان (مغریـب). ئەوەیە كە نوێژخوێن لەسەر سمتی دادەنیشێت و قاچی چەپانی لە ژێـر قـاچی ڕاسـتی دادەنێـت، وە قـاچی ڕاسـتی دادەكوتێت.

١١. لە تەحیـاتی یەكەم و دووهەم، لەوكـاتەی دادەنیشـێت تـا كۆتـایی تەحیـاتەكە ئامـاژە بە پەنـجەی شـایەتومانی دەكات، وە لە كاتی پاڕانەوەشدا دەیجوڵێنێت.

١٢. صـــەلاوات دان و بەرەكەت بـــۆ ســـەر محـــمەد ﷺ وبۆخـــانەوادەكەی و بـــۆ ســـەر ئیبـــراهیم، وە بـــۆ ســـەر خانەوادەو نەوەی ئیبراهیم، لە تەحیاتی یەكەمدا.

١٣. پاڕانەوە لە تەحیاتی كۆتاییدا

١٤. دەنـگ هەڵبـڕین لەكـاتی خوێنـدنی قورئـان لە نـوێژی بەیانیان و جومعە و نـوێژی جەژنەكـان و باران بارین، وە لە دوو ڕكاتی یەكەمی نوێژی مەغریب و عیشادا.

وانه گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

١٥. بە بێ دەنگی خوێندنی قورئان لە نوێژی نیوەڕوان و عەسرو لە ڕکاتی سێهەمی مەغریب و وە دوو ڕکاتی کۆتایی نوێژی عیشا.

١٦. خوێندنی قورئان لەدوای سورەتی فاتیحە لەگەڵ ڕەچاو کردنی باقی سونەتەکانی تری ناو نوێژ، بێجگە لەوانەی باسمان کردن. لەوانەش: ئەو زیادەیەی کە نوێژخوێن دەیڵێت لەدوای (ربنا ولك الحمد) و لەدوای بەرز بوونەوە لە ڕکوع بۆ ئیمام و نوێژخوێنانی دوای ئیمام و ئەو کەسەی بەتەنیا نوێژ دەکات سونەتە. هەروەها دەست دانان لەسەر ئەژنۆکان بە کراوەیی پەنجەکان لە کاتی ڕکوعدا.

## وانەی یازدەهەم: ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە

کە هەشتن:

١. قسەکردنێک بەویست و ئاگای بێت، وەزانابێت کە قسەنوێژبەتاڵ دەکاتەوە. ئەوەی بیری چوو یان ئەوی نەیزانی ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە.

٢. پێکەنین[1]
٣. خواردن
٤. خواردنەوە
٥. دەرکەوتنی عەورەت
٦. زۆرلابدەیت لە ئاراستەی قیبلە ، (واتە سەیرکردنی ئەم لاو ئەو لای قیبلە) .
٧. جوڵەی زۆرو لەدوای یەك لە نوێژدا.
٨. نەمانی دەست نوێژ

## وانەی دوازدەهەم: مەرجەکانی دەست نوێژ

کە دەدانەن :

ئیسلام، ژیری، جیاکردنەوە، نیەت، وە نیەتەکەی بەردەوام بێت تا کۆتایی دەست نوێژەکە، بڕین و وەستاندنی ئەو شتانەی کە دەستنوێژواجب دەکەن ،وەتارات گرتن پێش دەست نوێژ،وە ئاوەکە پاک و حەڵاڵ بێت،وەلابردنی ئەوشتانەی کە نایەڵێت ئاوەکە بگات بە پێستەکە، وە داخڵ بوونی کاتی نوێژ بۆ ئەو کەسەی کە بەردەوام دەستنوێژی دەشکێت.

---

١ پێکەنینێکی بە دەنگ بەشێوەیەک دەنگت لێوە بێت، ئەگەر پێکەنینەکە بێ دەنگ بوو ئەوا نوێژەکە بەتاڵ نابێتەوە.




وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

## وانەی سیازدەهەم: فەرزەکانی نوێژ

کەشەشـن: دەم وچـاو شـۆردن کە ئـاو لە دەم و لـووت وەردانـیش دەگـرێتەوە. وەشـۆردنی هەردوودەسـت لەگەڵ ئەنیشـکەکان. وە مەسـح کردنـی هەمـوو سـەر کەگـوێیەکانیشی لە گەڵدایە. وە شۆردنی پێیەکان هە تا قولە پێکان، وە ریزبەندی ئەمانەی سەرەوە، وە شۆردنیان بەدوای یەکدا. وە موستەحەبە کە دەم وچاو و دەستەکان و قاچەکان سێ جار بشـۆردرێن لەگەڵ ئـاوو لە دەم و لـووت وەردان. بەڵام ئەوەی کە فەرز بێـت تەنهـا یەک جـارە. بەڵام مەسـحی سـەر موستەحەب نییە کە دووبارە بکرێتەوە، هەروەک چۆن بەڵگە هەیە لەسەر ئەمە لە فەرمووده دروستەکاندا.

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

## وانەی چوادەهەم: ئەو هۆکارانەی کە دەست نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە

ئەوانیش شەش هۆکارن: دەرچوونی هەر شتێک لە پێش و پاشی مرۆڤ ، دەرچوونی هەر شتێکی پیس لە لەش، نەمان و لە دەستدانی ژیری بە خەوتن یاخود هەر شتێکی تر، دەست بەرکەوتنـی عەورەت لە پـێش یـان پـاش بە بـێ بەربەسـت،

خواردنی گۆشتی ووشتر، پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام (خودای گەورە پەنامان بدات).

## ئاگادارییەکی گرنگ:

شوشتنی مردوو ، ڕاست وایە دەست نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، ئەویش ووتەی زۆربەی زانایانە، وە هیچ بەڵگەیەکیش نیە لەسەر ئەم باسە، بەڵام ئەگەر هاتوو دەستی مردوو شۆرەکە بەر عەورەتی مردووەکە بکەوێت بە بێ بەربەست، ئەوا پێویستە دەست نوێژ بگرێتەوە وەهەروەها پێویستە لەسەر مردووشۆرکە دەست نەدا لەعەورەتی مردوو مەگەر لە پشت بەربەستێکەوە بێت.

وە هەروەها دەست بەرکەوتنی ئافرەت دەست نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، بە شەهوەتەوە بێت یاخود بەبێ شەهوەت، بەمەرجێک هیچ شتێکی لێوە دەرنەچێت، ئەویش ڕاسترین ووتەی زانایانە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانی ماچ کردووەو پاشان نوێژی کردووە بە بێ ئەوەی دەست نوێژ بگرێتەوە.



وانه گرینگه‌کان بۆ تێکڕای موسڵمانان
وانه گرینگه‌کان بۆ تێکڕای موسڵمانان

بەڵام ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، لە هەردوو سورەتی [النساء : ٤٣] وە سورەتی [المائدة : ٦]دا ، مەبەست پێی جیماعە (واتە جووت بوون لەگەڵ خێزانی خۆت) نەک بەرکەوتن، ئەمەش لە ڕاسترین وتەی زانایانەوە هەروەها ڕای ابن عەباسیشە ڕەزای خودای گەورەیان لێ بێت، وە ڕای کۆمەڵێک لە زانایانی پێشین و پاش پێشینیشە. وە خودای گەورەش سەرخەرو پشتیوانمانە.

## وانەی پازدەهەم: خۆ ڕازاندنەوە بە ڕەوشتە دروستە جوانەکان بۆهەموو موسوڵمانێک

خۆ ڕازاندنەوە بە ڕەوشتە دروستە جوانەکان لەوانە: ڕاستگۆیی، پاراستنی ئەمانەت، داوێن پاکی، شەرم کردن، ئازایەتی، بەخشندەیی، بە وەفایی، خۆ پاک ڕاگرتن لەو شتانەی کە خوای گەورە بە حەرامی داناوە، باش بوون لەگەڵ دراوسێ، هاوکاری لێ قەوماوان بەگوێرەی توانا، وە هەروەها ئەو ڕەوشتانەی تریش کە لە قورئان و سونەت هانی داوین بۆ کردنیان .

## وانەی شازدەهەم: لە خۆ گرتنی ئادابە جوانەکانی ئیسلام

لە خۆ گرتنی ئادابە جوانەكانی ئیسلام وەک:

سەلام كردن، ڕووخۆشی، خواردن و خواردنەوە بە دەستی ڕاست، وە (**بسم الله**) لە كاتی دەست پێ كردندا، وە ستایشكردنی خودای گەورە (**الحمد لله**) لە كۆتایدا، وە وتنی (**الحمد لله**) لە پاش پژمین، وە وەڵام دانەوەی بە (**یرحمک الله**) ئەگەر یەكێك پژمی و وتی (**الحمدالله**)، سەردانی نەخۆش، شوێن كەوتنی جەنازە بۆ شاردنەوەو نوێژكردن لەسەری، ئادابە دروستەكان لە كاتی چوونە ناو مزگەوت و ماڵ و هاتنە دەرەوە لێیان، وە لەكاتی سەفەر، لەگەڵ دایک و باوک، خزمان و دراوسێكان، لەگەڵ گەورەو بچوک، و پیرۆزبایی كردن لەكاتی منداڵ بووندا، پیرۆزبایی ژن و ژن خوازی،وە پرسەوسەرەخۆشی لەكاتی ناڕەحەتیدا، وە هەروەها زۆرێكی تر لە ئادابەكانی پۆشین ولەبەر كردنەوەی جل و بەرگ و پێڵاو.

## وانەی حەڤدەهەم: بە ئاگایی و ئاگادار بوون لە هاوەڵ پەیداکردن و جۆرەکانی سەرپێچی

**لەوانە:** ئەو حەوتەی کە بە هیلاکـت دەبـات (الموبقـات) ئەوانـیش: هـاوەڵ پەیـدا کـردن بـۆ زاتـی اللـه، سیحرو جادوو کردن، کوشتنی کەسێک کە خوای گەورە حەرامـی کـردووە جـگە لەوەی کە حەقە بکوژرێـت، خـواردنی سـوو (الربـا)، خواردنی ماڵی هەتیوو، هەڵهاتن لە گۆڕەپانی جەنگ، باس کردن و تۆمەتبارکردنی ئەو ئافرەتە داوێن پاکە ئیماندارانەی کە بێ ئاگان .

هەروەها: پێشێل کردنی مافی دایـک و باوک، بچڕانـدن و نەگەیانـدنی سـیلەی ڕەحـم، شـایەتی دان بە درۆ، سـوێند خواردن بە درۆ، ئازاردانی دراوسـێ، ستەم کردن لە خەڵك لە سـەندنەوەی خوێنـدا، وە لە سـاماندا، وە لە شـەرەف و ناموسـی خەڵکیدا، خواردنەوەی مادده هۆشـبەرەکان، وە یـاری کـردن بە قومار، غـەیبەت کردن، قسە هێنان و بردن، وە هەندێکی تریش کە خودای گەورە یان پێغەمبەر ﷺ نەهییان لێ کردووە.

## وانەی هەژدەهەم: کفن و دفن و ئامادە کردنی مردوو و نوێژ کردن لەسەری

فەرموون لەگەڵ درێژەی ئەم باسەدا:

**یەکەم: ڕێگەپێدراوە تەڵقین لە سەرەمەرگدا.**

ئەو کەسەی لەسەرە مەرگدایە تەڵقین دەکرێت بە {لا الـه الا الـله}، بە بەڵـگەی ئەوەی کە پێغەمـبەر ﷺ فەرمـوویەتی (لقنـوا موتـاکم: **لا الـه الا الـله**)[1]، واتـا تەڵقینی مردووەکانتان بدەن بە لا الـه الا الـله، ئیمامی مسلم لە صـەحیحەکەیدا گێڕاویەتەوە. وە مەبەست لە مـــردوو لەم فەرمـــوودەیەدا ئەو کەســـانەن کە لە سـەرەمەرگدان، کە دیاردەکـانی مـردن لێییـان دیـاری داوە.

**دووەم: ئەگەر لە مردنـــی دڵنیـــا بـــووین** ئەوا چاوەکـانی دەنوقێنین و دەمی دادەخەین لەبەر ئەوەی لە سـوونەتدا وا هاتووە.

---

١ مسلم الجنائز ٩١٦، الترمذي الجنائز ٩٧٦، النسائي الجنائز ١٨٢٦، أبو داود الجنائز ٣١١٧، ابن ماجه ما جاء في الجنائز ١٤٤٥، أحمد ٣/٣.



وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان
وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

**سێهەم: پێویستە مردووی موسڵمان بشۆرێت،** تەنها شەهید نەبێت کە لە گۆڕەپانی جەنگدا بمرێت، ناشۆردرێت و نوێژیشی لەسەر ناکرێت، بەڵکو بە جلو بەرگەکەیەوە دەنێژرێت بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کوژراوانی غەزای ئوحودی نەشۆردو نوێژیشی لەسەر نەکردن.

**چوارەهەم: چۆنیەتی شۆردنی مردوو**

عەورەتی دادەپۆشرێت، کەمێک بەرز دەکرێتەوە، ئەوجا سکی دەشێلرێت، شێلانێکی هێمنانەو لەسەرخۆ. وەئەوجا مردووشۆرەکە پەڕۆیەک لەدەستی دەئاڵێنێت و (دەکرێت دەستەوانە بەکاربێنێت) پاکی دەکاتەوەو تاراتی بۆ دەگرێت، پاشان دەستنوێژی بۆ دەگرێت وەک دەستنوێژێک بۆ نوێژکردن، پاشان سەرو ڕیشی دەشوات بە ئاو و سیدر[1] یان هەرشتێک لەو شێوازە. پاشان لای ڕاستی دەشوات ئەوجا لای چەپ.

پاشان بۆ جاری دووهەم و سێهەم بەم شێوەیە دەیشواتە. وە هەموو جارێک دەست دێنێت بە سکی دا و ئەگەر

---

[1] سیدر: داری نەبقە ، کە دارێکی بۆن خۆشە

شتێكی لێ دەرچوو پاكی دەكاتەوەو دەیشواتەوە، وە ئەو شوێنە دادەخات بە لۆكە یان شتێك لەو بابەتە. ئەگەر دانەخرا ئەوا بە قوڕێكی پاكی بەهێز دایدەخات، یان هەر هۆكارێك كە لە بواری پزیشكیدا بەكار بێت وەك بەستەرو شتی تر.

پاشان دەست نوێژەكەی بۆ دووبارە دەكرێتەوە. وە ئەگەر بە سێ جار شۆردن پاك نەبووەوە دەكرێت بكرێتە پێنج جار یان حەوت جار. پاشان وشك دەكرێتەوە بە پۆشاكێك، وە بۆنی خۆش دەدرێت لە بن باڵەكانی و لەو شوێنانەی كە سوجدەی پێ دەبرێت[1] وە وا باشە لە هەموو لەشی بدرێت. وە كفنەكەی بۆن خۆش دەكرێت. وە ئەگەر نینۆكەكانی یان سمێڵی درێژ بوو كورت دەكرێتەوە ئەگەر نەش كرێت كێشەیەك نابێت.

وە پرچی داناهێنرێت، وە بەری ناتاشرێت، وە خەتەنە ناكرێت، لەبەر نەبونی بەڵگەی شەرعی. وە ئافرەتان

---

١ ئەو ئەندامانەی سوجدە دەبات حەوتن (ناوچاوان، لەپی هەردوو دەست، هەردوو ئەژنۆ، هەردوو سنگی پێیەكان)



وانه گرینگه‌كان بۆ تێكڕای موسڵمانان
وانه گرینگه‌كان بۆ تێكڕای موسڵمانان

پرچیان دەکرێتە سێ پەلکەوە و لە پشتەسەریانەوە بەردەدرێتەوە.

**پێنجەم: کفن کردنی مردوو**

باش وایە پیاوان بەسێ پۆشاکی سپی کفن بکرێن کە کراس و کڵاوی لەگەڵدا نەبێت، هەر وەکو چۆن بۆ پێغەمبەر ﷺ کراوە.

وە ئەگەر کفن بکرێت بە کراسێك و ئیزارێك[1] و لەفافێك[2] کێشەیەك نابێت.

وەئافرەتان بە پێنج پۆشاك کفن دەکرێن: ئەوانیش (کراس، سەرپۆش، ئیزار، دوو لەفاف) وە منداڵ ئەگەر کوڕ بێت بە یەك تا سێ پۆشاك کفن دەکرێت. وە منداڵ ئەگەر کچ بێت بە کراسێك و دوو لەفاف کفن دەکرێت.

بۆ هەموو مردوویەك واجبە یەك پۆشاك بکرێت کەهەموو لاشەی داپۆشێت.

---

١ ئیزار: ئەو پارچە قوماشەیە کە لە کەمەر بۆ خوارەوە دا دەپۆشێت.

٢ لەفاف: ئەو پارچە کفنەیە(قوماشە خامەیە) کە هەموو لاشەی مردوەکە دادەپۆشێ و پێی دەپێچرێتەوە.



وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

بەڵام ئەگەر مردووەکە لە ئیحرامی حەج یان عومرەدا بوو ئەوا بە ئاو و سیدر دەشۆردرێت و بە ئیزارو ریدائەکەیەوە[1] یان هەرشتێکی تر کە لە بەریدابیت کفن دەکرێت، وە دەموچاو و سەری داناپۆشرێت وە بۆنیشی لێنادرێت، چونکە ڕۆژی قیامەت کە زیندوو دەکرێتەوە تەلبیە[2] دەکات.

هەروەك لەم بارەیەوە فەرمودەی صەحیح لە پێغەمبەر ﷺ گێڕراوەتەوە. وە ئەگەر ئافرەت لە ئیحرامدا بوو ئەوا کفن دەکرێت هەروەکو لە ئیحرامدا نەبێت. بەڵام بۆنی خۆشی لێ نادرێت وە دەموچاوی بە نیقاب داناپۆشرێت و دەستەوانەشی لە دەست ناکرێت. بەڵام دەست و دەموچاوی بەو کفنە دادەپۆشرێت کە پێی کفن دەکرێت، هەروەکوو چۆن باسی کفنی ئافرەتمان کرد لە پێشتردا.

---

١ ریداء: ئەو پارچە قوماشە یە کە لەسەر شانەکانەوە تا خوار کەمەر دادەپۆشێت.

٢ تلبیە: وتنی (لبیك اللهم لبیك... لەکاتی حەج و عەمرەدا)

وانە گرینگەکان بۆ تێکرای موسلمانان

**شەشەم: کێ لەپێشترین کەسە کە مافی شۆردن و کفن و نوێژ کردنی هەبێت لە سەر مردوەکە.**

لە پێشترین کەس کە مافی شۆردن و کفن و نوێژ کردنی هەبێت لە سەری ئەوکەسەیە کە وەصیەتی پێکردوە، واتا (ئەوکەسەیە کە وەصیەتی پێ کردووە ئەو بیشوات).

پاشان باوك پاشان باپیر پاشان ڕیزبەندی لە کەسانی نزیك لە پشتی پیاو...

وە لە پێشترین کەس بۆ شۆردنی ئافرەت وەصیەتەکەیەتی وە ئەگەر نەبوو دایکی پاشان دایە گەورەی پاشان ڕیزبەندی لە ئافرەتە نزیکەکانییەوە وەک خوشك و پور...

وە ژن و مێرد ئەتوانن یەکتری بشۆن، لەبەر ئەوەی ئەبوبەکری صدیق (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانەکەی خۆی شۆردی. وە عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) فاطیمەی خێزانی شۆرد.

**حەوتەم: چۆنیەتی نوێژ کردن لەسەر مردوو.**

چوارجار(الله اکبر) دەکرێت، دوای یەکەم (الله اکبر) سورەتی فاتیحە دەخوینێت، ئەگەر سورەتیکی کورت

یان ئایەتێك یان دوانی خوێند لەگەڵی باشە، بەهۆی بوونی فەرموودەی صەحیح لەم بارەیەوە کە ابن عەباس (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕاویەتیەوە.

ئەوجا (اللە اکبر)ی دووهەم دەکرێت و صەلاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ لێدەدرێت، هەروەکوو ئەو صەلاواتەی کە لە تەحیاتا هاتوە. پاشان (اللە اکبر)ی سێهەم دەکرێت ودەڵێن:

**(اللهم اغفر لحينا وميتنا، وشاهدنا وغائبنا، وصغيرنا وكبيرنا، وذكرنا وأنثانا، اللهم من أحييته منا فأحيه على الإسلام، ومن توفيته منا فتوفه على الإيمان، اللهم اغفر له وارحمه وعافه واعف عنه، وأكرم نزله ووسع مدخله، واغسله بالماء والثلج والبرد، ونقه من الخطايا كما ينقى الثوب الأبيض من الدنس، وأبدله دارا خيرا من داره، وأهلا خيرا من أهله، وأدخله الجنة، وأعذه من عذاب القبر، وعذاب النار، وافسح له في قبره، ونور له فيه، اللهم لا تحرمنا أجره، ولا تضلنا بعده)**

واتا: یاالله خۆشببە لە مردوو زیندوومان، لە ئامادە بوان و لە وانەش کە لێرە نین، لە گەورەو بچوکمان، لە نێرو مێمان، یا الله ئەوەمان کە دەی ژیەنی لەسەر ئیسلام بیژییەنە، وە ئەوەمان کە دەی مریەنیت لەسەر ئیمان بیمرێنە، یاالله لێی

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان
وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

خۆشببە و ڕەحمی پێ بکە، لەوسزایەی چاوەڕێیەتی ولەو گوناحانەی کردویەتی بیبەخشەو لێی ببورە، وە لە گۆڕەکەیدا ڕێزی لێ بنێ، گۆڕەکەی بۆ فراوان بکە، بیشۆرەوە لە گوناح بە ئاو و بەفرو تەرزە، وە لە گوناح پاکی بکەرەوە هەروەکوو چۆن پۆشاکی سپی پاك دەبێتەوە لە پیسی، وە ماڵەکەی بۆ بگۆڕە بە ماڵێکی باشترو خێزانیشی بۆ بگۆڕە بە باشتر، وە بیخەرە بەهەشتەوە، وە پەنای بدە لە سزای گۆڕو سزای ئاگر، وە گۆڕەکەی بۆ فراوان بکە، وە بۆی ڕۆشن بکە، وە لە پاداشتەکەی بێ بەشمان نەکەیت و لە دوای ئەم مردووە سەرمان لێ نەشێوێنیت.

پاشان (الله اکبر)ی چوارەم دەکرێت و تەنها بە لای ڕاستدا سەلام دەداتەوە، وە سوننەتە لەگەڵ ووتنی هەر (الله اکبر)ێکدا دەست بەرز بکاتەوە.

وە ئەگەر مردووەکە ئافرەت بوو دەوترێت (اللهم اغفر لها...) ڕاناوی مێینەی (لها) بۆ بەکار دێت، خوایە گیان لێی خۆشببە.

وە ئەگەر جەنازەکان دوان بوون ئەوا دەوترێت (اللهم اغفر لهما...) دەستەواژەکە دەکاتە دوان (لهما) هەتا کۆتایی، وە ئەگەر جەنازەکان لەوە زیاتر بوون، دەڵێت

(اللهم اغفر لهم...) بۆ کۆ (هم) بەکار دێنێت. بەڵام ئەگەر مـــردووەکە بچـــوک بـــوو لەبـــری داوای لێخۆشبوون، بەم شێوەیە دوعای بۆ دەکات

**(اللهـم اجعلـه فرطـا وذخـرا لوالديـه، وشـفيعا مجابـا، اللهـم ثقل بـه موازينهمـا، وأعظـم بـه أجورهمـا، وألحقـه بصـالح سـلف المؤمـنين، واجعلـه في كفالة إبراهيم عليه الصلاة والسلام، وقـه برحمتك عذاب الجحيم)**

واتـا: یـا الـلە بیکەرە خێرێك کە دایـك و بـاوکی وەپێش خۆیان دابێت بۆ قیامەتیان، وە توێشو و زەخیرەیەك بێت بۆیـان، وە داواکـارێکی داوا گیـراو بێـت بۆیـان، وە تەرازویـانی پـێ سـەنگین بکەیـت. وە پاداشـتیانی پـێ گەورە بکەیـت، وە بیگەیەنە بە چاکـان و ئیمانـدارانی پێشین وە لەومنـاڵانە بێت کە لە ژێر چاودێری ئیبراهیم دان _ ، وە بە ڕەحمەتی خۆت پارێزراوی بکە لە ئاگری دۆزەخ.

وە سوننەتە ئیمامەکە لە ئاستی سەری پیاوان بوەستێت و لەنـاو قەدی ئافرەتانـدا، وە ئەگەر چەنـد جەنـازەیەک هەبـوو ئەوا پیـــاوان بەدوای یەکـــدا و پاشـــان ئافرەتـــان. وە ئەگەر منـداڵیان تیـا بـوو ئەوا کـوڕان پـێش ئافرەتـان دێـن، پاشـان ئافرەتـان ئەوجـا کچـان. وە دەبێت سـەری کـوڕەکە لە ئاسـتی

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان
وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

سەری پیاوەکە بێت، وە ناوقەدی ئافرەتەکە لە ئاستی سەری پیاوەکە بێت، وە سەری کچەکەش لە ئاستی سەری ئافرەتەکە بێت، وە ناوقەدی دەکەوێتە ئاستی سەری پیاوەکەوە، وە نوێژخوێنان هەموو لە دوای ئیمامەکەوە دەوەستن. کەسێك کە شوێنی نەبێت ئەتوانێت لای ڕاستی ئیمامەکەوە بوەستێت.

**هەشتەم: چۆنیەتی ناشتنی مردوو**

ڕێگە پێدراوە کە گۆڕ قوولْ بکرێت تا ناوقەدی پیاوێک وە (لحد) گۆڕیچەشی هەبێت بە ئاڕاستەی قیبلە. وە مردووەکە لەسەر لای ڕاستی بخرێتە گۆڕیچەکەیەوە، وە گرێکانی کفنەکەی بکرێتەوەو بە کراوەیی بەجێ بهێڵرێت. وە دەموچاوی بەدیار نەخرێت چ پیاو بێت چ ئافرەت. پاشان خشتی لەسەر دادەنرێت وە بە قوڕسواغ دەدرێت تا جێگیر بێت. وە خۆڵی دەکرێت بەسەرد. ئەگەر خشت دەست نەکەوت ئەکرێت بە شتی تر وەک پارچە لەوح و تەختەبەرد یان تەختەدار بەکار بهێنرێت. خۆڵ دەکرێت بەسەریداو بە



وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان
وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

خۆڵ دادەپۆشرێت، وە سونەتە لەو کاتەدا[1] بووترێت (**بسم الله وعلى ملة رسول الله**) واتا بە ناوی خودا و لەسەر سوننەت و شەریعەتی پێغەمبەری خودا ﷺ وە گۆڕەکە هێندەی بستێک بەرز ئەکرێتەوە، وە ئەگەر هەبوو وردە بەردی لەسەر دادەنرێت و ئاو پرژێن دەکرێت.

وە سوننەتە لەسەر ئامادە بووان لای گۆڕەکە بووەستن و دوعای خێری بۆ بکەن. چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێک لە ناشتنی مردووەکە تەواو دەبوو لای گۆڕەکە دەوەستاو دەیفەرموو (**استغفروا لأخيكم واسألوا له التثبيت، فإنه الان يسأل**)[2] واتا داوای لێخۆشبوون بۆ براکەتان بکەن، وە داوای دامەزراوی بۆ بکەن، چونکە ئێستا پرسیاری لێدەکرێت.

---

[1] لە کاتی داهێڵانیدا بۆ ناو گۆڕەکە

[2] ابو داود الجنائز ۳۲۲۱

**نۆهەم: کەسێک کە نوێژی نەکردبێت لەسەر مردوەکە ڕێگەی پێدراوە کە نوێژی لەسەر بکات دوای ناشتنی.**

لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەمەی کردووە، بەمەرجێک نوێژکردنەکە لەماوەی مانگێکدابێت یان کەمتر وە ئەگەر لەماوەی مانگێک زیاتر بوو ڕێگە نادرێت و ناشەرعیە نوێژ بکرێت لەسەر گۆر، لەبەر ئەوەی هیچ شتێکمان پێ نەگەیشتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە نوێژی کردبێت لەسەر گۆر دوای تێ پەڕبوونی مانگێک بەسەر ناشتنی مردوودا.

**دەهەم: جائز نییە بۆ کەس و کاری مردووەکە خواردن دروست بکەن بۆ خەڵکی.**

بە بەڵگەی فەرموودەی جەریری کوڕی عەبدوولای ئەلبەجەلیی، هاوەڵی بەڕێز ڕەزای خوای لێبێت، کە دەفەرموێ: (کۆبونەوە لایماڵی مردووەکە و دروست کردنی خواردن دوای ناشتنی بە هاتوهاوارو پیشەی نەفامی دەمان دایە قەڵەم). ئیمامی ئەحمەد بە سەنەدێکی حەسەن ریوایەتی کردووە.

بەڵام خواردنیان بۆ دروست بکەیت یان بۆ میوانەکانیان کێشەیەکی تێدا نییە. وە شەرعیە بۆ خزمان و

وانە گرینگەکان بۆ تێکرای موسلمانان

دراوسـێکان کە خواردنیـان بـۆ دروسـت بـکەن، لەبەر ئەوەی کاتێـک پێغەمـبەر ﷺ هەواڵـی مردنـی جەعفەری کوڕی ئەبی طالیبی پێ گەیشت ڕەزای خوای لێ بێت لەشام، فەرمانی کرد بە ماڵەوەیان کە خواردن دروست بکەن بۆ ماڵی جەعفەر، وە فەرمووی: (إنه أتـاهم مـا يشـغلهم )[1] بەڕاستی شتێک هـاتووە بەسەریاندا کە مەشغوڵی کردون.

وە کێشەیەک نابێت کە خاوەن مردووەکە دراوسێکان یان کەسانێکی تر بانگ بکەن تا لەو خواردنە بخۆن، کە بۆیان هاتووە، وەکاتی دیاری کراو بۆ ئەمە نییە، ئەوەندەی بیزانم لە شەرعدا.

**یازدەهەم: ڕێ پێ نەدراوە بۆ ئافرەتان خۆیان بگرنەوە لە جوان پۆشی و بۆن خۆشی** لەبەر خاتری مردوو زیاتر لە سێ ڕۆژ، تەنها بۆ مێردەکانیان نەبێت، کە واجبە لەسەریان واز بێنن لە جوان کاری ڕووخسارو پۆشاک بۆ ماوەی چوار مانگ و دە ڕۆژ. وە ئەگەر سکی پڕ بوو، ئەوا هەتا منداڵەکەی دەبێت. لەبەر

---

١ الترمذي الجنائز ٩٩٨، أبو داود الجنائز ٣١٣٢، ابن ماجه ما جاء في الجنائز ١٦١٠.




وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

ئەوەی لە سوننەتی صەحیحی پێغەمبەردا ﷺ ئەمە چەسپاوە.

بەڵام پیاوان نابێت وازبێنن لە هیچ جوان پۆشی و بۆن خۆشییەک بۆ مردوو، نزیک بێت یان دوور.

**دوازدەهەم: ڕێ پێ دراوە بۆ پیاوان کە سەردانی گۆڕستان بکەن،** لەکاتێک بۆ کاتێکی تر، تا دوعای خێریان بۆ بکەن و بیر لە مردن و دوای مردن بکەنەوە. بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ : **(زوروا القبور، فإنها تذكركم الآخرة)**[1] واتا (سه ردانی گۆرستان بکەن، چونکە ئاخیرەتتان وە بیردێنێتەوە)

وە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵەکانی فێردەکرد کەسەردانی گۆڕستانیان کرد بلێن **(السلام عليكم أهل الديار من المؤمنين والمسلمين، وإنا إن شاء الله بكم لاحقون، نسأل الله لنا ولكم العافية، يرحم الله المتقدمين منا والمستأخرين)**[2] واتا سەلامتان لێ بێت ئەی دانیشتوانی ئەم گۆڕستانە، لە

---

١ مسلم الجنائز ٩٧٦، النسائي الجنائز ٢٠٣٤، أبو داود الجنائز ٣٢٣٤، ابن ماجه ما جاء في الجنائز ١٥٦٩، أحمد ٤٤١/٢.

٢ مسلم الجنائز ٩٧٥، النسائي الجنائز ٢٠٤٠، ابن ماجه ما جاء في الجنائز ١٥٤٧، أحمد ٣٥٣/٥.




رانه گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

موسوڵمان و ئیمانداران، بە ویستی خودای گەورە ئێمەش پێتان دەگەین وە داوا کارم لە خودای گەورە ئێمەو ئێوەش سەلامەت بکـات، وەڕەحـم بکـات بەوانەمـان کـە پێشـتر مـردوون وە بەوانەشمان کە دواتر دەمرن.

بەڵام ئافرەتان سەردانی گۆرستانیان بۆ نیە، لە بەر ئەوەی پێغەمـبەر ﷺ ، لەعنەتـی کـردوە لەو ئافرەتـانەی سـەردانی گۆرسـتان دەکەن ، وە لەبەر ئەوەی ئافرەتـان ترسـی ئەوەیـان لێدەکرێت کـە توشـی فیتـنە ببن و نەتـوانن ئـارام بگـرن، وە بەهەمان شێوە نابێت شوێن جەنازە بکەون بۆسەر قەبران چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری ئەمەشی لێ کردوون.

بەڵام نوێژکردن لە سەر مردوو لە مزگەوت یان لـە شـوێنی نوێژکردن (مصلی) جائیز و ڕێ پێدراوە بۆ هەمـووان لـە ژنـان و پیاوان.

ئەمەش کۆتـایی ئەو بابەتـانە بـوو کە ئاسـان بـوو کۆکردنەوەی

وە صەلات و سەلامی خودای گەورە لەسـەر پێغەمـبەر ﷺ و ئال وبەیت و هاوەڵانی بێت.



وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان
وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

# ناوەرۆك



وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان
وانە گرینگەکان بۆ تێکڕای موسڵمانان

